رمضان كريم

# ڕۆژوو شکێنەرە هاوچەرخەکان
# لە مەزهەبی شافعی

کورتەیەک لە ڕوونکردنەوەی ( د. لبیب ) لەسەر منظومة ی
"ڕۆژوو شکێنەرە هاوچەرخەکان" لە نوسینی ( د.علی القدیمی )

ئامادەکردن و ڕێکخستن : ابي شريفة الجاوي



## پوختەی

## ڕۆژوو شكێنەرە هاوچەرخەكان لە مەزهەبی شافیعی

### ئەوەی ڕۆژوو دەشكێنێت بەبێ ڕاجیاوازی و وردەكاری

١. سپرای (پرژێن)ی تەنگە نەفەسی
٢. جگەرە كێشان
٣. نێرگلە كیشان
٤. تەحامیل
٥. ئێنیما
٦. هەر شتێک بخرێتە پێش و پاشەوە
٧. هەرشتێک لە ڕێگەی دەم و لووتەوە بخرێتە ناوەوە
٨. ئامێری وێنەبینی گەدە
٩. قەستەرە یان سوندەی بۆری گورچیلە

### ئەوەی ڕاجیاوازی تێدایە لە شكاندنی ڕۆژوو

١. قەترەی گوێ
- ئەوەی کە پشت پێ بەستراوە ئەوەیە کە دەشکێت
- ڕای بەرامبەر: ڕۆژوو ناشکێنێت ئەم بۆچوونەش بەهێزترە

٢. قەترەی چاو
- ئەوەی پشت پێ بەستراوە ئەوەیە کە ڕۆژوو ناشکێنێت
- وە هەندێک لە شافعیە هاوچەرخەکان دەڵێن: دەیشکێنێت

٣. دەرزی
- ڕاجیاوازی تێدایە، بەڵام بەهێزترین بۆچوون ئەوەیە کە نایشکێنێت

### ئەوەی كە بە وردەكاریەوە ڕۆژوو دەشكێنێت

١. بێ هۆشکردن یا سڕکردن
- ڕۆژوو دەشکێنێت گەر سڕکردنی گشتی بێ و تا کۆتایی ڕۆژەکە درێژە بکێشێت

٢. بنێشت
- ڕۆژوو دەشکێنێت ئەگەر بجوێ و تێکەڵی لیک ببێت

٣. گەڵای قات و تووتن
- ڕۆژوو دەشکێنێت ئەگەر بجوێ و تێکەڵی لیک ببێت

٤. مەلەوانی
- ڕۆژوو دەشکێنێ گەر ئاو بچێتە هەناو

٥. هەویری ددان
- ڕۆژوو دەشکێن گەر تێکەڵی لیک ببێت و قوت بدرێت

٦. ئەوەی دەچێتە نێوان ددانەکانەوە
- ڕۆژوو دەشکێنێ گەر بە مەبەستەوە قووت بدرێت

بەشی یەکەم

## ئەوەی ڕۆژوو دەشکێنێت بەبێ ڕاجیایی و ووردەکاری

**پرژێنی تەنگە نەفەسی Inhaler:**

د.نوح القضاة الشافعي موفتی ئوردن دەڵێت: وەرگرتنی پرژێنی تەنگەنەفەسی لە ڕێگەی لووت یان دەمەوە ڕۆژوو دەشکێنێت، چونکە ئەو چارەسەرەی لەم پرژێنانەوە وەردەگیرێت مەبەست لێی گەیاندنیانە بە دوو سییەکان کە لە ناوەوەی جەستەن.

زانایانی فوقەهای شافیعی ئەوەی کە باسیان کردووە دەربارەی شکاندنی ڕۆژوو بە پرژێن(سپرای) لەسەر ڕاپۆرتەکانی ئەم مەزهەبە لەسەر دوو شت دەڕوات:

١ـ "سک" لەبەشەکانی ناوەوەی جەستەی مرۆڤ دەژمێررێت بەبێ جیاوازی لە مەزهەبەکە دا: جا چ بگات بە کۆئەندامی هەناسە یان کۆئەندامی هەرس جیاوازی نیە.

٢ـ وە لەسەر دەستلێهەڕگرتنی ئەویش بەوەی کە ئەو بەشەی دەچێتە کۆئەندامی هەرسەوە زۆر کەمە، ئەوا ئێمە بە کەمی نازانین و دەستی لێهەڵناگرین بەو هۆیەوە.



پرژێنی تەنگە نەفەسی

**جگەرە cigarrete:**

جگەرە یەکێکە لەو شتانەی ڕۆژووی ڕۆژووەوان دەشکێنێت

خاوەنی کتێبی (بغية المسترشدين) دەڵێت: "هەرشتێک کە سەرچاوەی تێدابێت، وەک بۆنی تووتن واتە ڕووەکی تووتن یان تنباک ـ نەفرەتی خودا لەو کەسەی کە دایهێنا ـ چونکە یەکێکە لە داهێنراوە ناشرین و بێزراوەکان ـ جا بەوە ڕۆژوو دەشکێت " ( بغية المسترشدين: ل ٢١)



جگەرە

**نێرگەلە hookah:**

زانا محمدی کوڕی عبدالباري ئەهدەل دەڵێت: ئەو دووکەڵەی کە لە ڕێگەی سۆندەی نێرگلەوە دەکێشرێت، ڕۆژووشکێنەرە، هەروەک کۆمەڵێک لە زانایانی پاشینە ئاماژەیان پێداوە، ئەو دووکەڵەش وەک دووکەڵی بخور و ئاگردان نیە کە بەرز دەبێتەوە، چونکە لەبەر کەمیەکەی سەرچاوەی لێ دروست نابێت، لەبەر ئەوەشە کە پێشەوا ئیبنو حەجەر جەختی کردۆتەوە لەسەر ئەوەی کە دوکەڵی بخور ڕۆژووی پێ ناشکێ،بە پێچەوانەی دووکەڵی ئەو سۆندە کە بە نێرگلە ناسراوە کە مایە و سەرچاوەی لێ دروست دەبێت، چونکە ئەوە دووکەڵێکی کەڵەکە بووی پیسی بینراوی هەیە، بۆیە کێشانی دروست نیە بۆ ڕۆژووەوان. (إفادة السادة العمد: ل٣٥٠)



نێرگەلە



تەحامیل



ئامێری وێنەبینی گەدە



ئینیما

ـ تەحامیل یان هەرشتێک کە دەخرێتە پێش و پاشەوە.. ئەوانە ڕۆژووشکێنەرن.

ـ وێنەبینی گەدەش لە ڕێگەی دەمەوە دەبێت جا لە ڕێگەی  ماددەی چەورکراوە بێت یاخود نا بۆ ئاسانی گەیشتن بە گەدە ئەوا رۆژوو دەشکێنێت، چونکە بریتیە لە سەرچاوە و مایەیەک کە گەیشتووەتە ناوەوەی لاشە لە ڕێگایەکی کراوەوە، وە هەمان حوکم بۆ ئینیما( ئامێری وێنەبینی یاخود دەرزی کۆم : کە ئامێرێکە دەخرێتە ناو لەشەوە لە پاشی مرۆڤەوە.

ـ هەمان حوکم بۆ هەرشتێک لە ڕێگای لوتەوە بخرێتە ژوورەوە ، ئەوا ڕۆژوو دەشکێنێت، چونکە ڕێگاکەرەوەن بۆ چوونە ناو لاشە لە دەرچەیەکی کراوەدا.





قەستەرە یان سۆندەی بۆری گورچیلە

قەستەرە یان سۆندەی بۆری گورجیلە ڕۆژووشکێنەرە، چونکە بریتیە لە خستنە ناوەوەی لوولەیەک بۆ زەکەری پیاو یاخود ڕەیرەوی میز بۆ ئافرەت، بە جۆرێک کە یەکێک لە لایەکانی لە ناوەوەی لاشەیە (میزڵدان)، بەشەکەی تریشی لە دەرەوەیە بۆ ئەوەی میزەکە کۆبکاتەوە لە کیسەیەکی تایبەت،

ـ ئەم لوولەیە کە دەخرێتە ناوەوە بۆ میزڵدان بۆ دەرچوونی میز، وە بۆ چەن رۆژێکیش دەمێنێتەوە

* ئەو ڕۆژەی دەخرێتە ژوورەوە ڕۆژوو دەشکێنێت ئەگەر لەکاتی ڕۆژوو دانرا، وە لە ڕۆژی لادانیشی ئەگەر لە ڕۆژدا لابرا.

* لەو ڕۆژانەی کە پێوەیەتی ئەوا ڕۆژوو ناشکێنێت.

بەشی دووەم

# ئەوەی ڕاجیاوازی تێدایە لە شکاندنی ڕۆژوو

قەترەی گوێ



## ووتەی یەکەم:

(کە ئەمەیان پشت پێ بەستراوە)

ـ الخطيب فەرموویەتی: (قەترە بۆ ناوەوەی گوێیە ئەگەر نەشگات بە مێشک) واتە: ڕۆژوو دەشکێنێت (مغني المحتاج)

ـ لە کتێبی (بغية المسترشدين) هاتووە: لە (القلائد) دا ووتوویەتی: شێخمان فەتوای داوە دەربارەی کەسێک کە ئەگەر گەردێک بچێتە گوێیەوە و ئازاری دا ئەوا دروستە ئاو بخرێتە ناوی، وە ڕۆژووەکەی دەشکێنێت و پێویستە ڕۆژووەکە بگرێتەوە)

ـ لە کتێبی (الفقه المنهجي) هاتووە :قەترەی گوێ ڕۆژوو دەشکێنێت ( چونکە دەرچەیەکی کراوەیە)

## ووتەی دووەم:

(کە ئەمە ڕای ئیمام غەزالیە)

ئەحمەد الشاطري لە شیکردنەوەی کتێبی الياقوت النفيس ووتوویەتی: (ووتەیەک باسدەکەم لە مەزهەبی شافیعی لە بەرامبەر ووتە ڕاستەکەدا): ڕۆژوو ناشکێت بە چوونە ناوەوەی ئاو بۆ ناو گوێ(وە ئەوەش ووتەیەکی بەهێزە) واتە: لە لایەنی لێکدانەوە، بەڵام لە مەزهەب دا ئەم ووتەیە پێچەوانەی ووتە ڕاست و پشت پێبەستراوەکەیە.

ـ لە کتێبی التقريرات السديده هاتووە: (زانستی نوێی پزیشکی سەلماندویەتی کەوا گوێ دەرچەی نیە)



## قەترەی چاو

### ووتەی یەکەم:

(کە ئەمەیان پشت پێ بەستراوە)

ئەوەی پشت پێ بەستراوە لە مەزهەبدا ئەوەیە کەوا چاو دەرچەیەکی کراوەی نیە بۆ ناوەوە، بۆیە بە قەترە تێکردنی ڕۆژوو ناشکێنێت، ئەگەرچی هەستیشی کرد بە تامەکەی لە گەروویدا.

### ووتەی دووەم:

(هەندێک لە پەیڕەوانی مەزهەبی شافعی لە سەردەمی نوێدا)

. هەندێک لە پەیڕەوکرانی مەزهەبی شافعی لە سەردەمی نوێ دا دەڵێن کەوا چاو دەرچەیەکی کراوەی هەیە، بە پیی سەلمێنراوی زانستی پزیشکی نوێ؛ (التقريرات السديدة ٤٨١)

ئەمەش وەڵام دەدرێتەوە: کەوا ئەم دەرچەیە بەهۆی بچوکی و دیارنەبوونی پاشکۆیەکە لە کونیلەکانی پێست بۆیە کاریگەری نابێت.



## دەرزی

### ووتەی یەکەم:

(بە ڕەهایانە ڕۆژوو دەشکینێت)

ـ جا لە ڕیگەی ماسولکەکان یان دەمار یان ژێر پێست یان لە ڕیگەی مۆخی ئێسکەوە بێت، جا بۆ خۆراک بێت (موغەزی) یان بەهێزکردن یان زیادکردنی خوێن یان سڕکردنی دەمار یان چارەسەری نەخۆشیەک بێت.

### ووتەی دووەم:

( بە ڕەهایی ڕۆژوو ناشکێنێت)

ـ محمدی کوڕی سالم البیجاني ووتوویەتی: دەرزی بۆ قۆڵ و ڕان یان هەر شوێنێکی جەستە بێت ڕۆژوو ناشکێنێت، ئەگەر هاتوو دەرمانەکەی بە هەموو جەستەیشیدا بڵاوبوویەوە یان هەست بە تامەکەی کرا لەسەر زمان.

وە ئەمەش بەهێزترینی ووتەکانە.

### ووتەی سێیەم:

ووردەکاری تێدایە

ئەگەر خۆراک پێدەربوو ئەوا ڕۆژوو دەشکێنێت

گەر هاتوو خۆراک پێدەر(موغەزی) نەبوو ئەوا

گەر لە ڕێی خوێنهێنەرەکان بوو ڕۆژوو دەشکێنێت

گەر لە ڕێی ماسولکەکانەوە بوو ڕۆژوو ناشکێنێت



# بێ هۆش کردن سڕکردن

## ئەگەر لە ڕێی دەرزیەوە بوو

(ئەوا ئەو ڕاجیاوازیەی تێدایە کە لە پێشەوە باسمان کرد
وە لەسەر ئەو ووتەیەی کە ڕۆژوو ناشکێنێت)

گەر نیوە بەنج (مەوزوعی) بوو ئەوا ڕۆژوو ناشکێنێت.

گەر هاتوو بەنجی گشتی (عام) بوو و بە درێژایی هەموو ڕۆژەکەی خایاند ئەوا ڕۆژووەکە دەشکێنێت

ئەگەر بۆ یەک ساتیش بێت بەهۆش هاتەوە ئەوا ڕۆژووەکەی دروستە.

## (ئەگەر هاتوو لە ڕیگەی لووت یان لە ڕێی گازەوە بوو)

سەرنجی تێدایە:

گەر هاتوو تەنها شوێنەوارێک بوو نەک سەرچاوە ئەوا ڕۆژوو ناشکێنێت

گەر هاتوو سەرچاوە بوو ئەوا ڕۆژوو دەشکێنێت ئەگەر گەیشتە ناوەوەی جەستە

ئەوەی زۆرێک لە پزیشکان دەڵێن ئەوەیە کە گازەکان دەگەنە مێشک و گەدە و دەبێتە هۆی حاڵەتێک کە لە بێهۆشبوون دەچێت و بەو هۆیەوە ڕۆژووەکە پووچەڵ دەکەنەوە.

بەشی سێیەم

# ئەوەی کە بە وردەکاریەوە ڕۆژوو دەشکێنێت

بنێشت



گەر لەشی بوونەوری دا شتێکی تێدابوو تێکەڵ بە لیک بێت و قووت بدرێت ئەوا ڕۆژوو دەشکێنێت

گەر لە شی بوونەوەی دا شتێکی تێدانەبوو وەک پارچە لاستیکێکی نەرم ئەوا ڕۆژوو ناشکێنێت

نیترۆجلسرین




ئەو حەبەیە کە دەخرێتە ژێر زمانەوە لە لایەن نەخۆشانی دڵەوە بەکاردێت

ئەگەر هیچ شتێک لەبەشەکانی لەگەڵ لیکدا نەچنە ناوەوە ئەوا ڕۆژوو ناشکێنێت.

گەر تێکەڵ بوو بەشێکی لەگەڵ لیک چوویە ناوجەستەوە ئەوا ڕۆژوو دەشکێنێت

**چونکە دەمی سەبارەت بە چوونە ژوورەوەی ئەگەر لیکی لەگەڵ ئەژمار نەکەین، ئەوە لە بەشەکانی دەرەوە لەبەرچاو دەگیرێت نەک لە ناوەوە.**

**چونکە لیک بە تەنها ڕۆژوو ناشکێنێت بە مەرجێک پاک بێت و تەنها خۆی بێت،جا ئەگەر شتێکی تێکەڵ بوو کەوا بوویە گۆڕانکاری بۆ ڕەنگ و تام و بۆن ئەوا زیان دەگەیەنێت بە ڕۆژوو.**

ڕووەکی قات

ڕووەکی شەممە

گەر بەشێکی تێکەڵ نەبوو لەگەڵ لیک نەچوویە ناو جەستە ئەوا ڕۆژوو ناشکێنێت

گەر بەشێکی تێکەڵ بوو لەگەڵ لیک و چوویە ناو گەروو ئەوا ڕۆژوو دەشکێنێت

مەلەوانی

ئەگەر ئاوەکە گەیشتە ناو جەستە یان دەمار یان ناوەوەی گوێ، تەنانەت ئەگەر ئاوەکە پێشتر بەبێ مەبەست هاتبێتە ژوورەوە ئەوا ڕۆژوو دەشکێنێت.

ئەگەر هیچ لەو ئاوە نەگەیشتە ژوورەوە ئەوا ڕۆژوو ناشکێنێت

**الرملی ووتوویەتی: ئەگەر زانرا کە خووی ئەو کەسە ئەوەیە کە بە چوونە ژێر ئاودا ئاو دەگاتە گەدەی یان مێشکی، و نەتوانرێت خۆی لێی بەدوور بگرێت، ئەوا چوونە ژێر ئاو لەسەری حەرامە و ڕۆژووەکە بە ڕەهایی دەشکێنێت.**

## هەویری ددان



رۆژوو ناشکێنێت، ئەگەر هیچی لێ نەهاتە ژوورەوە یان ئەو لیکەی کە تێکەڵی بوو قوتی نەدا

**سەید عبدالله بن محفوظ الحداد ووتوویەتی : زیانی نییە، ئەگەر پارێزگاری بکات کە هیچ شتێک لە هەمان هەویرەوە یان لیکی تێکەڵکراوەوە نەچێتە ژوورەوە، هەروەها ئەو تامە زیان ناگەیەنێت کە دەمێنێتەوە چونکە شوێنەوارییە نەک سەرچاوە**



## ئەوەی کە دەچێتە نێوان ددانەکانەوە

ئەگەر قووت بدرێت ئەوا رۆژوو دەشکێنێت

**د.محمد حسن هیتو ووتوویەتی: هەر خواردنێک لە ددانەکاندا بمێنێتەوە، دەبێت لێی بکۆڵێتەوە و دەری بکات، ئەگەر بە مەبەست قوتی دا، بە گوێرەی مەزهەبی شاعفییەکان ڕۆژووەکەی دەشکێنێت**